زانستی درۆی ئەمڕۆ وای لە خۆمان و نەوەکانمان کردووە کە شەرم بکەین بڵێین ئێمە نەوەی باوکە گەورەمان آدم و دایکە گەورەمان حواء ین.

دەبینین هەندێك بەناو موسڵمانیش مەن ڕیکلام بۆ ئەو زانستە خەیاڵییە دەکەن و بەئاشکرا پەرەی پێ دەدەن.

با بزانین الله چی پێمان فەرمووە و صحابة بەڕێزەکانیش چۆن تەفسیری ئایەتەکانیان کردووە.

قال تعالی : | **وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ** | (**سورة البقرة : ٣٥**) .

**عبدالله بن مسعود** و **عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێن :

کاتێک ئادەم علیه السلام لە بەهەشت نیشتەجێ بوو ، لەناویدا دەگەڕا هەستی بە غەریبی و دڵتەنگی دەکرد هاوسەرێکی نەبوو تاکو ئارامی پێ ببەخشێت.

جا ئادەم خەوت ، پاشان بەخەبەر هات ئافرەتێك لەپاڵ سەری دانیشتبوو ، الله لە پەراسووی ئادەم دروستی کردبوو ، ئادەم ووتی: تۆ کێی؟

ووتی: ژنم.

ئادەم ووتی: بۆچی دروستکراویت؟

ووتی: تاکو ئارامیت پێ ببەخشم.

فریشتەکان ویستیان بزانن زانستی ئادەم گەیشتووەتە چ ئاستێك ، پرسیاریان لە ئادەم کرد ووتیان: ناوی چیە؟

ووتی: حواء.

ووتیان: بۆ ناونراوە حواء؟

ووتی: چونکە لە شتێکی زیندوو (حي) دروستکراوە.

جا الله فەرمووی: | وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ |

**تفسير الطبري**

**ابن عباس** رضي الله عنهما دەڵێت :

ئادەم عليه السلام لە بەهەشت نەمایەوە إلا بە قەدەر ماوەی نێوان نوێژی عەسر بۆ خۆر ئاوابوون.

**تفسير عبد بن حميد**

ابن عباس رضي الله عنهما دەڵێت :

ئادەم عليه السلام لە ڕۆژی هەینی دروستکرا لەدوای عەسر ، سوێند بە الله لەمڕۆژەدا خۆر ئاوانەبوو تاکو ئادەم لە بەهەشت هاتە خوارەوە.

تفسير عبدالرزاق

سعيد بن جبيردەڵێت :

ئادەم عليه السلام لە بەهەشت نەمایەوە إلا بە قەدەر ماوەی نێوان نیوەڕۆ و عەسر.

الزهد لأحمد

الحسن البصري دەڵێت:

ئادەم عليه السلام سەعاتێك لە ڕۆژدا لە بەهەشت مایەوە ، ئەم سەعاتەش بە قەدەر ١٣٠ ساڵی کاتی دونیا بوو.

الزهد لأحمد

موسى بن عقبة دەڵێت:

ئادەم علیه السلام لە بەهەشت مایەوە بۆ ماوەی چارەکە ڕۆژێك ، ئەم ماوەیەش دوو سەعات و نیو بوو ، ئەمەش دەکاتە **٢٥٠** ساڵ ، ئادەم بۆ ماوەی **١٠٠** ساڵ بۆ بەهەشت گریا.

**زوائد عبدالله علی المسند**

پرسیارێك:

ئایا ڕاستە ئادەم علیه السلام هەر لەسەر زەوی بووە و لە بەهەشت نەبووە ، ئەو بەهەشتەی کە باس دەکرێت هەر لەسەر زەوی بووە؟

ئەم قسەیە خەون و خەیاڵە!

هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر شتێکی لەو شێوەیە ، زۆر سەیرە موسڵمانان ئاوڕ لەم جۆرە قسانە دەدەنەوە ، ئەسڵ وایە کە ووترا بەهەشت ئەو بەهەشتە بێت کە لە ئاسمانە و ئێمەی مرۆڤ دەیزانین ، نابێت هیچ لفظ ێك لە حەقیقەتەوە بگۆڕین بۆ مەجاز یان لە ظاهر ـەوە بگۆڕین بۆ واتایەکی تر إلا بە بەڵگە و قەرینەیەك نەبێت.

بۆ نموونە الله تعالی لە سورة "القلم" باسی سێ براکە دەکات کە خاوەنی باخ بوون و لە بەروبوومی باخەکەیان نەبەخشیوە ، دواتر الله سزای داون و باخەکەی لێ ووشك کردوون بە "أصحاب الجنة" ناویان

دەبات. جنة واتە باخ ، ئایا لێرە مەبەستی بەهەشتە یان باخ؟ هەر لە سیاق ەکە ڕوونە مەبەستی باخە.

یاخود کاتێك لە سورة "الكهف" باسی چیرۆکی پیاوە کافرەکە دەکات کە بە زۆری ماڵ و سامان و منداڵەکانی دەنازێت دەفەرموێت: | **وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا** | (**الكهف : ٣٥**) .

چووە ناو جەننەتەکەی ، ئایا واتە چووە ناو بەهەشتەکەی یان چووە ناو باخەکەی؟ لە سیاق ی ئایەتەکە ڕوونە مەبەستی باخەکەیەتی نەوەك بەهەشتی ئاسمان.

جا کاتێک باسی ئادەم علیه السلام دەکرێت کە لە بەهەشت بووە لەگەڵ هاوسەرەکەی ، باسی ئەوە دەکات کە فریشتە لەگەڵی بوون و بینیویانە قسەیان لەگەڵ کردووە ، باسی ئیبلیس دەکات کە کاتی خۆی لەگەڵ فریشتەکان بووە لە ئاسمان ، کاتێك لە بەری دارەکە دەخۆن الله دەیاننێرێت بۆ سەر زەوی دەفەرموێت: | **قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ** | (سورة **البقرة : ٣٨**)

"      اهبطوا" ، هبط بە واتای دابەزین لە بەرزییەوە بۆ خوارەوە دێت ، گەر ئادەم علیه السلام لەو بەهەشتەی ئاسمان نەبووبێت بەڵکو لە باخێکی سەر زەوی بووبێت ، ئەوکات واتای "هبوط" (دابەزین) چیە؟

ئەمە جگە لەوەی چەندەها فەرموودە و ئاثار هەن کە باسی ئەوە دەکەن ئادەم لە بەهەشت بووە ، بۆ نموونە فەرموودەی موناقەشەی ئادەم و موسی علیهما السلام ، کە موسی بە ئادەم دەڵێت: تۆ باوکمانی تۆ ئێمەت خستە دەرەوە لە بەهەشت، واتە بەهۆی خواردنت لە بەری دارەکە بێ بەش بووین لە بەهەشت .

بەڕاستی پێم سەیرە لەگەڵ هەبوونی ئەم هەموو بەڵگە ڕوونانە موسڵمان دڵی پەیوەست بێت بەم شوبهە هیچانەوە کە هیچ بەڵگەیەکی ڕوونیان لەسەر نیە.

دەڵێن: نیشتەجێ بوونی ئادەم علیه السلام لە بەهەشت بابەتێکی یەکلاییکەرەوە نیە ، بەڵکو قسەی لەسەرە ، گەر ئادەم علیه السلام لە بەهەشت بێت ئەی چۆن ئیبلیس هاتە بەهەشت و پێی ووت لە بەری دارەکە بخۆ ، خۆ پێشتر ئیبلیس لە بەهەشت دەرکرا کاتێك سوجدەی بۆ ئادەم علیه السلام نەبرد ، ئەی چۆن دواتر گەڕایەوە بەهەشت؟

وەڵام:

سەرەتا پێمان بڵێن چ کەسێك ئەم قسەیەی کردووە؟

کام هاوەڵ

کام تابعین

کام سەلەف

کام خەلەف

کام مفسر

کام زانا

ناوی زانایەکی معتبر ی ئەم ئوممەتەمان پێ بڵێن قسەیەکی لەو شێوەی کردبێت کە گەڕانەوەی ئیبلیسی بۆ بەهەشت کردبێتە هۆکاری ئەوەی کە ئادەم علیه السلام لە بەهەشت نەبووە و هەر لەسەر زەوی بووە.

قسەی وامان نەبیستووە ، گەر کەسێك هەیە لەمانەی سەرەوە وا دەڵێت فەرموو پێمانی بڵێن تاکو ئێمەش حیساب بۆ خیلافەکەی بکەین ، بەڵام گەر ئێوە هەر بە عەقڵی خۆتان لە باسەکە بڕوانن و بڵێن مادام ئیبلیس لە بەهەشت دەرکرا و دواتر گەڕایەوە کەواتە ئادەم علیه السلام

له بەهەشت نەبووە بەڵكو لەسەر زەوی بووە. ئەمەیان بەرهەمی ئەقڵی خۆتانە کە ئێمە حەقمان بەسەریەوە نیە و خۆمان پێوە خەریك ناکەین. بەڵام گەر بێتو وەك پرسیار کردن بۆ فێربوون بپرسن ئایا کە ئیبلیس لە بەهەشت دەرکرا دواتر چۆن گەڕایەوە بەهەشت بە ئادەمی ووت لە بەری دارەکە بخۆ؟

ئەوا ئێمەش وەڵامتان دەدەینەوە:

دەڵێین بگەڕێنەوە بۆ تەفسیری سەلەف لە ئایەتی : | **فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ** | (سورة البقرة : ٣٦)

لە هاوەڵان و تابعین هاتووە کە ئیبلیس دوای دەرکردنی لە بەهەشت چۆن گەڕایەوە بەهەشت :

ئیبلیس چووە ناو لاشەی مارێکەوە کە ٤ پەلی هەبوو هاوشێوەی حوشتر ، بەهۆی ئەم مارە گەڕایەوە ناو بەهەشت و قسەی لەگەڵ ئادەم علیه السلام کرد کە لە بەری دارەکە بخۆن تاکو هەرگیز نەمرن "تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ" ، الله سزای مارەکەیدا بەوەی کە هەر ٤ پەلی لێسەندەوە و وای لێکرد لەسەر خۆڵ بخشێت ، وەك ئێستا دەبینین مار گیاندارێکی خشۆکە.

...وَقُلْنَا ٱهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّۖ...

دوای خواردنی ئادەم و حەواء لە بەری دارەکە الله پێیان دەفەرموێت کە دابەزن بۆ سەر زەوی ، گەر پێشتر لە بەهەشت نەبووایەن چۆن لە زەوییەوە دادەبەزین بۆ زەوی؟؟

هەروەها سەبارەت بە ضمیر ـەکە کە واو الجماعة ـەیە لە ووشەی "اهبطوا" مەبەست پێی کێیە؟

سەلەف دەڵێن: ئادەم و حەواء و ئیبلیس و مارەکەیە.

ئەمەش بریتیە لە تەفسیری هەریەك لە:

- ابن مسعود
- ابن عباس (لە چەند ڕێگایەکەوە)
- مجاهد
- السدي الكبير
- أبو العالية
- أبو صالح باذام

- وهب بن منبه

- الربيع بن أنس

- يحيي بن سلام

پاشان سەیری کۆتایی ئایەتەکە بکەن :

| **فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ** | (**سورة البقرة : ٣٦**)

دوای ئەوەی اللّٰه دەریان دەکات لە بەهەشت لەکۆتاییدا دەفەرموێت | **وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ** | لە زەویدا جێگیر دەبن و دەمێننەوە .

| **وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ** | واتە: تاکو ڕۆژی قیامەتە.

(ئەمەش دووبارە بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کەس ناتوانێت لە زەوی دەربچێت و هەر لەسەر زەوی دەمێنینەوە).

باشە گەر خۆیان هەر لەسەر زەوی بن چ پێویست دەکات باسی دەرکردنیان بکات بۆ زەوی؟ لە زەوی دەرکراون بۆ زەوی ، بیر بکەرەوە!!!

الطبري لەگەڵ هێنانی بەشێك لە تەفسیری سەلەف لەم بارەیەوە بە سێ خاڵ ئەم تەفسیرە بە صواب دادەنێت:

- مفسرین كۆكن لەسەری و بەڕاستیان زانیوە (مەبەستی هاوەڵان و تابعین و دوای ئەوانە).
- هیچ ریوایەتێك نیە كە خیلافی ئەم ریوایەتە بێت و ڕەتی بكاتەوە.
- لە ڕووی ئەقڵەوە ئەمە شتێك نیە مەحاڵ بێ ڕوودانی.

بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێنەوە بۆ تەفسیرەكانی سەلەف لە ئایەتی ٣٠ ی سورة البقرة.

سەرنجێك:

ژمارەیەك لە خەلەف و معاصرین ئەم تەفسیرەی سەلەف ڕەتدەكەنەوە كە ئیبلیس لەناو لاشەی مارەكە چووەتەوە بەهەشت بە بیانووی ئەوەی ریوایەتی ئیسرائیلیاتە ، زۆر دڵیان بەمە خۆشكردووە هەر ریوایەتێك لە سەلەفەوە بێت ئەقڵ بەلایەوە غریب بێ ڕێك دەڵێن ئیسرائیلیاتە و ڕەتیدەكەنەوە ، ئەمەش مەنهەجێكی هەڵەیە و پێچەوانەی مەنهەجی سەلەفە لە هاوەڵان و تابعین و تابعي تابعین.

گەرنا سەیری عەمەلی سەلەف بکەین دەبینین وەکو احتجاج کردن ریوایەتی بەشێکی زۆر لە اسرائیلیات دەکەن نەك تەنها وەك گێڕانەوە.

سەبارەت بەم فەرموودەیەش "بەنی ئیسرائیل نە بە درۆ بخەنەوە نە بە ڕاستیان بزانن" ، سەلەف باشتر لە ئێمە لێی تێگەیشتوون ، بۆ نموونە الطبري کە موفەسیرێکی ڕەخنەگرە ریوایەتەکان هەڵدەسەنگێنێت و ڕەخنەیان لێدەگرێت و ترجیحات دەکات ، نابینیت لە یەك شوێنی تەفسیرەکەی ریوایەتێك ڕەتبکاتەوە بە بیانووی ئەوەی ئەمە ئیسرائیلیاتە ئەگەرچی هاوەڵەکە یان تابعیەکە مەشهور بێت بە ریوایەتی اسرائیلیات ، بۆیە ئەم مەنهەجە هەڵەیە و دژی مەنهەجی سەلەفە کە ئیسرائیلیات بە ڕەهایی ڕەتبکرێتەوە. دەبینین تەفسیرەکانی سەلەف پڕە لە ئیسرائیلیات و احتجاج پێکردنی ، بەڵام تەفسیرەکانی خەلەف و معاصرین تا توانیویانە خۆیان پاراستووە لە ئیسرائیلیات ، ئێ واللە گەر ئیسرائیلیات شتێکی خراپ بووایە لەناو تەفسیردا ئەوا سەلەف پێش خەلەف و معاصرین وازیان لێ دەهێنا ، چ جای احتجاج ی پێبکەن (لو کان خیرا لسبقوکم إلیه).

بەهەرحاڵ ئەمە تەنها ئاماژەیەکی زۆر کورت بوو و باسی ئیسرائیلیات قسەی زۆری دەوێت ، پێویستی بە نامیلکە و کتێبە ، بگرە پێویستی بە رسالة ی ماستەر و دکتۆرا هەیە تا مەنهەجی سەلەف ڕوونبکرێتەوە لە

تعامل کردن لەگەڵ ریوایەتی ئیسرائیلیات ئایا بۆ احتجاج ڕیوایەتیان کردووە یان تەنها بۆ گێڕانەوەیە و نە باوەڕیان پێ بکەن و نە بە درۆیان بزانن.

تێبینی: کە دەڵێم هەندێك لە مفسرین ی خەلەف و معاصرین ریوایەتی مارەکە ڕەتدەکەنەوە بە بیانووی اسرائیلیات ، مانای ئەوە نیە کە بڵێن ئادەم علیه السلام لە بەهەشت نەبووە ، بەڵکو نیشتەجێ بوونی ئادەم لە بەهەشت بڕاوەتەوە و هیچ زانایەك قسەی لەسەر ئەمە نیە ، بەڵام هەندێکیان چیرۆکی مارەکە ڕەتدەکەنەوە بە بیانووی ئیسرائیلیات.

| فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ | (سورة طه : ١٢٠)

ئەم ئایەتە دژی چوونە ژوورەوەی ئیبلیس نیە بۆ بەهەشت لە ڕێگای مارەکەوە چونکە لێرەشدا قسە لەگەڵ ئادەم دەکات: | قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ |

بگرە لە تەفسیری ئەم ئایەتەش سەلەف دووبارە باسی مارەکە دەکەن ، پاشان ووشەی "وسوسة" شتێک نیە تەنها بە دڵ بکرێت و بە زمان

نەكرێت ، بۆ نموونە كەسێك دێت قسەت بۆ دەكات لە بابەتێكدا توشی وەسوەسە و قەلەقیت دەكات بەبێ ئەوەی بچێتە ناو دڵتەوە.

هەندێك كەس استدلال بەم ئایەتە دەكەن كە گوایە ئیبلیس تەنها لە دوورەوە وەسوەسەی بۆ دڵیان دروستكردووە و نەچووەتە لایان قسەیان بۆ بكات.

بگەڕێنەوە بۆ تەفسیری سەلەف .

https://t.me/Dastan_M_Archive